٦

ڕەوشە

لە قەیرانەکانی فەرهەنگی کوردەواری

# سەری ساڵی زایینی و پەیوەندی بە کوردەوە

مسعود عبدالخالق

**بەناوی خودا**

## پەیوەندی کورد بە جەژنی سەری ساڵ

شیکردنەوەیەکی فـەرهەنگی ســـایکۆلـۆجیە

## پێشەکی:

**لە مێژووی کورد تەنها دوو جەژن هەبووە هەردووکیان تایبەت بووە بە ئاینی کورد (ئیسلام)، لە دوای سەرهەڵدانی ئایدۆلۆژیای نەتەوایەتی لە کۆتایی سەدەی (١٩) بەرەبەرە نەورۆزیش بە جۆرێکی تر هاتە ڕیزی یادەکان، بەڵام یادکردنەوەی جەژنی سەری ساڵ بەو شێوەیەی کوردستان لە هەڵپەڕین و سەما و ئاڵ و گۆڕی پیرۆزی و بروسکە و زۆر نوێیە... دام ودەزگای حکومی هەریم یادی سەری سالی زاینی دەکەنەوە وەک جەژنێکی نیشتمانی پلە یەک، ئەوەش یادی لە دایک بوونی (ح عیسا)ی پیغمبەری خودایە و بۆ ئیستا پیغمبەری برا مەسیحیەکانمانە ،ئەوە کارێکی چاکە لە چوارچێوەی پاراستنی یەک ڕێزی نیشتمانی خەلکی کوردستان، کەچی بۆ یادکردنەوەی لە دایک بوونی (ح محمد) ئاوا ناکرێت لەوەوە هەلوەستەیەکی فەرهەنگی پێویست دەکا ،پیویستی بە توێژینەوەیەکی تایبەتی هەیە ،بۆ دۆزینەوەی هۆکارو ڕیشەی ئەو جۆرە دەردە ،**

**بۆ ئەوەی بتوانین سەرەتایەک لەو بارەیەوە بزانین بە چەند پرسیارێک دەست پی دەکەین: ئاخۆ چەندە ڕاستە ئەو ڕۆژە (١/١/...) یادی لە دایک بوونی (ح مەسیحە)؟ کەی سەری هەڵدا؟ لەچ ئاستێک پەیوەندی بە کورد هەیە؟ لە ڕووی سیاسی و فەرهەنگی سایکۆلۆجی مانای چییە؟ هۆکارو کاریگەرو سەرەنجامەکانی لە نێو کۆمەلگەی کوردەواری چیە ؟ بۆ ئەو مەبەستە ئەو کورتە توێژینەوە پیش کەشە ،کەلەسەرەتادا نوسینێکی ئاسایی بوو بەلام لەسەر داوای (گروپی ڕەوشەن) گەشەمان پێدا بۆ ئەوەی ببێتە نامیلکەیەک وخۆشیان چاپ کردنەکەی لە ئەستۆ دەگرن –جیگەی ریزە کە ئەو گەنجانە هەست بە مەترسی وەها دۆسیەیەک دەکەن وکاردەکەن لە پێناو ستاندەر کردنی ،واتە ڕەتکردنەوەی نیە وەک هەندی فتوای توند تەسلیم بوونیش نیە وەک هەندی لائیکی کورد ،بەلکو لە چوارچێوەی مەعقولیەتی خۆی هەقی پێ بدرێ.**

## جەژنی سەری ساڵ (کریسمس)

لە بنەچەدا ناوی (کریسمس) لە دوو برگە پێک هاتووە (کریس - واتە دڵسۆز) وە(ماس- واتە زایین یان لە دایک بوون)، ناوەکەشی (x mas) ڕۆمانیە لە ڕەچەڵەکدا لە (خریستۆس)ی یۆنانی هاتووە، ئەویش لە کۆپی هەرەکۆنی (ئینجیل)ی لاتینی هاتووە بە مانای (مەسیح ) ،کە بەمەسیحیان دەوترێ کریستیان لەوە هاتوە ،بەکورتی واتە دلسۆزانی مەسیح ،یان بەکوردی پەتی (عیسا پەروەر) ، جاریش وایە کریس بە مانای بەهرەی جیاواز دێت وزاراوەی کاریزمیش لەو سۆنگەوە سەری هەلداوە ،ئیستا کریسمیس لە تەقویمی (گریگۆری )١/١ لە ژێر سایەی عەولەمە بوویتە جەژنی گشتی.

ئەو جەژنە بەو مانایە لێک دەدرێتەوە گوایە لەو ڕۆژەدا (ح - مەسیح) لەدایک بووە، کراوەتە سەری ساڵ (١/١/...)،لەبەر ئەوەی ئەو یادە لە ئینجیل دیاری نەکراوە ،هەر ئاماژەیەکی بێ بەروار پێکراوە ( 8وكان في تلك الكورة رعاة متبدين يحرسون حراسات الليل على رعيتهم9 .واذا ملاك الرب وقف بهم ومجد الرب اضاء حولهم فخافوا خوفا عظيما10 .فقال لهم الملاك لا تخافوا.فها انا ابشركم بفرح عظيم يكون لجميع الشعب11.انه ولد لكم اليوم في مدينة داود مخلص هو المسيح الرب12 .وهذه لكم العلامة تجدون طفلا مقمطا مضجعا في مذود13 .وظهر بغتة مع الملاك جمهور من الجند السماوي مسبحين الله وقائلين14 المجد لله في الاعالي وعلى الارض السلام وبالناس المسرة)[١] ، لە شوێنێکی تر: فجمع كل رؤساء الكهنة وكتبة الشعب وسألهم: «اين يولد المسيح( مت ٢:٤).بۆیە ریوایەت وفرە بەروار سەر هەلدەدا.

وا پێدەچی لە زۆر کۆن کار بە بەرواری یەهودی کرابێتەوە کە پێی دەووترێ بەرواری (خەلق) دەکاتە نزیکەی ٥٧٧١خەلقی ئادەم ، دوای کاربە بەرواری (یادی دامەزراندنی ڕۆما کرا، بەو پێیە دەکاتە (٧٥٣ پ . ز)، تا سەدەی (٨ ز) ئینجا وەرچەرخا بۆ زایینی، هەرچی مێژووی یادکردنەوە و کردنە جەژنی ئەو ڕۆژە بەپێی سەرچاوەکانی ڕۆژئاوا یەکەم ئاهەنگی دەگەڕێتەوە بۆ ٣٣٦ی زاینی لە تەقویمی ڕۆمانی و ڕۆژی ٢٥ی مانگ نەک ١/١ ،وای بۆ دەچن ئەویش لە یادو ئاهەنگەکانی رۆمی کۆن بۆ (ساتۆرن- خواوەندی دروونە) و (میتراسی خواوەندی رووناکی)دەکرایەوە کە لە ١٧ی دیسمبر تا هەفتەیەک و بەندەکان ئەو هەفتەیە ئازاد دەبوون ، هەرچی مەوسوعەی(british enciclobidia ) دەلێت، یەکەم جار لەو شوێنەی ئێستای ئەڵمانیا سەری هەڵداوە، کاتێ ئەوان جەژنێکی تری دار و درەختیان هەبوو(وا پێدەچی نەورۆز بووبێ بە جۆری ئیزن دان بۆ گەشەی زراعی) یادی خوای مانگیان دەکردەوە لەو ڕۆژی ،واتە بەپێی ئەو سەرچاوە دەکاتە (٢٧ یان ٢٢ ز)، ٢٧ ساڵ دوای لە دایک بوونی مەسیح، ئەو کاتی پاپا (پۆنیفاسیوس) نوێنەرێکی بۆ لایان ناردو ڕێکەوتن کە ئەو ئاهەنگ تێکەڵ بەو یادە بکەن، بەو شێوەیە بووە نەریتێکی ساڵانە ، لەگەڵ تەشەنەی

[١] انجيل لوقا–اصحاح٢ اية(٨–١٣)

ئایینی مەسیحی زەق تر بۆ دەرەوە پەڕپەوە،چوە فەڕەنسا و بەریتانیا دوای چووە ئەمریکا زۆربەی وڵاتانی مەسیحی گرتەوە.

هەرچی جیهانی ئیسلامە جاران کاریان بە بەرواری عەجەمی دەکرد، دوای هاتنی ئیسلام کاریان بە بەرواری (کۆچی)دەکرد، کەمێکیش بە بەرواری ڕۆمی، تا نزیکەی سەدەی بیستەم بەرواری ڕۆمی و زایینی و کۆچی و فارسی و هندی هەبووە، دوای لەگەل گەشەی عەولەمە و زاڵ بوونی فەرهەنگی ڕۆژئاوا بەرەبەرە بەرواری زایینی بەسەر بەروارەکانی تر زاڵ بووە ،لە ڕێکەوتنەکانی عوسمانی و ڕۆژئاوایی هەردوو بەروار دەنووسرا، لە ڕیکەوتنی عێراق بریتانیش هەروا بوو، ئێستا هەموو جیهانی گرتۆتەوە تەنها ئێران بەرگریەک لەو زاڵی فەرهەنگیە دەکا و هێشتا کار بە کۆچی دەکا بەفەرمی، هەندی وڵاتی تریش لە هەندی بۆنە هەردوو بەروار لەپاڵ یەکتر دەنووسن، بەڵام لە کوردستان بی قەید و شەرت خۆیان داوەتە دەست ئەو بەروارە بی ئەوەی بزانن سەرەنجامی فەرهەنگی و سایکۆلۆجی چییە.

## ڕاستی و ناڕاستی ئەو یادە

لە کوردستان گەلێ جار خەڵکی بەسەما دێن و دوایی دەردەکەوی بی بنچینەیە، هەروەک سەربردەی دوو مارەکە سەرشانی زوحاک! ئینجا ئێستا ڤالانتاین وشەوی یەلدا وسەری سال ..،ماوەیەکە کورد لەگەل چەوساندنەوەی زۆری دووچاری کۆمەڵێک دەردی فکری سیاسی و فەرهەنگی بووە، لەگەل دووبارەبوونەوەی دەردەکەی لێ بوویتە (تەقەزومی فەرهەنگی)، ئیتر بی گوێدانە ڕاستی و ناڕاستی لەگەڵی دەهەژێتەوە، جاری هەموو مەسیحی لەسەر یەک یاد کۆک نین، (٣) بەشی سەرەکین، بەشێک پێیان وایە ئەو یادەی ئێستای کە لەسەری ئەو ساڵ دەکا (١/١/٢٠١٤) ڕاستیەکەی وانییە، بەڵکو (٤) ساڵ بەر لەوەیە، بەپێی سەرچاوەی گەورەی (اديان العالم) ئەو بەروارەی ئێستا (١/١/...)ەو تەواوە، هەرچی مەسیحیەکانی کاسولیک و پرۆتستانت بەشێکی ئەرسەدوکس و ئەرمەن (٦)ی ینایەر جەژنی لەدایک بوونی مەسیحە، ئەوروپای ڕۆژهەلاتی و قبتیەکانی میسر و یۆنان پێیان وایە (٧)ی ینایەرە، دەبی ئەوەش تۆماربکەین لای یەهودیەکان هێشتا (ح - مەسیح) لەدایک نەبووە کە بە (ماشیح) ناودەبری و پێیان وایە ئەو بەسەرکردەی جەنگی (هەرمجدۆن) هەڵدەستێت و سەربردەیەکی وەک (مهدی منتەزەر)ی موسڵمانانیان بۆی هەیە، لە تەورات مژدەی هاتنی داوە بەڵام لە ئینجیلی ئاماژەی رۆژی لەدایک بوونی مەسیحی تێدا نییە، کە بە ئینجیلی مەتی (ئایەتی ٢٣ - ٢:١٠) شتێکی لێڵی تێدایە-وەک لەسەروو باسمان کرد، بۆیە یادەکە پەرش و بڵاوە، بۆچونیکی تریش هەیە دەلێن کاتی خۆی رۆمەکان ئەو رۆژەیان بۆ (جانۆسی خواوەندی دەرگاکانی رەحمەت )دەکرایەوە ،دوای وەرچەرخا بۆ ئەو یادەی ئیستا .

بە کۆی گشتی هاتوونە سەر دوو یاد، لەسەر هەمان ئەو بنچینەی لێک جیایی ناردنی نێردراوەکەی پاپا پۆنی فاسیۆس بۆ ئەڵمانیا ئاماژە بە هەردوو بەروار (٢٧، ٢٢ز) کرابوو کە (٥) ڕۆژیان نێوانە، بۆیە بەشێکی زۆر (٢٥/١) دەکەنە جەژن ، بەشەکەی تر (١/١)، ئەوەی (٢٥/١) دەکاتە جەژن پشت ئەستوورە بە جەژنە کۆنەکانی زۆربەی شارستانیەتی میللەتانی جیهانە، هەر بە نموونە هەندێکی باس دەکەین:

لەچین (٢٥)ی ئەو مانگە (دیسمبر) یادی لەدایک بوونی خوایان (جانگ تی) بوو، لەنێو فارسی یادی خوای بەشەر (میترا)، لە هند (کریش)، لە کلدانی (کریس)، لە ئاسیا تاشەم (ڕتیس، کوڕی خوا) لە دایک ببوو، لە نەتەوەکانی ئەنگلۆسەکسونی (٢٥)ی مانگ یادی لەدایک بوونی خوا (چا، ئەپۆڵ) بوو، لە ڕوسیا یادی (کۆلیاد)، لە یۆنان (دیۆنیس) .... تاد ،بۆیە (٢٥) دیسمبر لەسەردەمی (ئیمپراتۆر خوسشەتین لە ٤ ز) تا ئێستا کراوەتە یاد.

یادی هاوشێوەزۆرە بۆنەکەی دیارنیە ، لای میسریەکانی کۆن سەری سال لەگەل دەرکەوتنی ئەستیرەی سوزیز وکاتی هەلسانی رووباری نیل بوە،دانیشتوانی میزوپۆتامیا لە بوهارو نەورۆزیش بۆ زۆربەی میلەتانی ئاری هەبوە . سەری سالی یەهودیش ناوی (رۆشهاشنامایە ) ،هندۆسەکانیش بەو شیوە،سەری سالی موسولمانان سالی کۆچیە ، ...

بەو شێوەیە یادەکە پەرش و بڵاوە، هەرچی مەسیحیەکانن دەڵێن ئێمە بەڵگە و پاساومان هەیە بۆ ڕوونی ئەو ڕۆژە و ڕاستی و دروستی ئەو بەروارەی کە ئێستا جیهان لەسەری دەڕوا، بابزانین چیە؟

## پاساوەکانیان

لەبەرامبەر ئەو پرسیارەی ئاخۆ چ پێوەرێک هەیە بیسەلمێنێ کە ڕۆژی لە دایک بوونی مەسیح (١/١)ە ، چونکە ئەو سەردەم تۆمار و نووسین بەو شێوە نەبووە، بەروار لەهەر شوێنێک بە پێی ڕووداوێکی گەورە بوو، هەروەک تا ئەو دواییەش لە کوردستان بە پێی (ساڵی گرانی) یان (جۆت نەهات) یان (ساڵی گەنمە سۆرەکە) مەودای مێژوویان دەقەبلاند، بۆیە زۆر بەدەگمەن یاخود مەحاڵ بوو بتوانری ڕۆژی لەدایک بوونی کەسێکی ئاسایی دیاری بکرێت و بمێنێت، ئەو گرفتە لە یادی لەدایک بوونی (ح محمد)یش هەیە ،زۆربەی پیاوە گەورەکانی جیهان بەرواری لەدایک بوونیان لیلە چونکە بە پیاوی گەورە لەدایک نەبووینە وەک مندالیکی ئاسایی لەدایک بووینە ،مەزنیەکەیان دوای دەردەکەوی،سەرەرای ئەوەش مەسیحیەکان (٣) پاساویان هەیە:

١. دەڵێن لە دایک بوونی (ح - مەسیح) ئاسایی نەبوو بەڵکو بووە دەنگ کە بەبی ڕەگەزی نێر لەدایک بووە.
٢. لەناو لانک قسەی دەکرد.
٣. بنەماڵەیەکی دیاریش بوون،(ح - مریم)خزمی نزیکی زەکەریا بووە.

بۆیە دەڵێن : ئەو یادە ورد و دروستە، ئەگەر بۆ کەمێکیش بێت هەڵوەستەیەکی لەسەر بکەین دەبینین ئەو پاساوانە لەژێر بارودۆخی ئەوسا لاواز دەردەچی، چونکە لەو سەردەمی دوو ئیمپراتۆر لە شام و فەڵەستین هەبوو، یەکیان (ئۆگستۆس) ئەوی تر (هیرادۆس) (لەهەردوو سەرچاوەی ڕۆژئاوایی - وێکبیدیا)، لە ئیسلامیش باسی دەکا، ئەوانە بەپێی پێشبینی کتێبێک بەناوی (دانیال) کە لە تەوراتیش بە ناڕاستەوخۆ لە (سفر دانیال)باس لە هاتنی (هیرۆدۆس) وەک ئەستێرەیەکی درەوشاوە دەکا ، بۆیە (ح - مریم) ترسا و زانی ئەوانە بەدوای دەگەڕێن بۆیە هەروەک لە قورئان باس لەنێو دارخورماکان و لە دەرەوەی ئاوەدانی لەدایک بووە و خەریکی خۆشاردنەوە بووینە و دوای بەرەو

میسر کۆچیان کردووە تا لە (٣/ئەپریل/ ٣٣ز) لە خاچ درا بە پێی سەرچاوەکانی خۆیان، کەواتە ووردی و دروستی لەدایک بوونی زۆر لێڵە.

## پەیوەندی بە کورد

ئەوەی سەروو کورتەیەک بوو لە دیاری کردن و دیقەی ئەو یادە واتە ئەو شەوەی (.../١/١) کە لە کوردستان فەرمیانە دەبێتە پشوو و جەژن و ئاڵوگۆڕی پیرۆزبایی و دوای دانس و هەڵپەڕین... لەبۆشە، بۆ ئەو مەبەستە بەچەند خاڵێک پەیوەندی کورد بەو یادە و ماناکان و سەرەنجامەکانی باس دەکەین لە بوارەکانی مێژوویی و فکری و ئایینی و سیاسی تا دەگاتە فەرهەنگی سایکۆلۆجی، بەو شێوەیەی خوارەوە :

١. ئەو یادە بەرەبەرە لەگەڵ هاتنی بەریتانیا بۆ ناوچەکە و لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمی لەشێوەی کۆبوونەوەی ئەوانەی پێیان دەووترا (ئەفەندی) لە یانەی خواردنەوە یان لە ماڵێک کۆدەبوونەوە و بەمەی خواردنەوە یادەکەیان دەکردەوە بە گۆرانیەکی (فریدەئەترەش) یان (کەلسوم) یان (عبدالحلیم حافز)، دوای لەگەڵ گەشەی دام و دەزگای دەوڵەتی مۆدێرن و بەعەلمانی کردنیان بەرەبەرە بووە پشووی فەرمی، یەکەم جار ئیتحاد و الترقی دایهێنا، دوای ئەتاتۆرک بڵاوی کردەوە، هەریەکە لە مەدرەسەکانی ناشیونالیزمی تورکی و عەرەبیش تەقەلایان دەدا ئەو یادە بکەنە فەرمی لەجیاتی جەژنەکانی تر، لە عیراقیش لەسەروبەری دروست کردنی دەولەتی عیراق لە سالی ١٩٢١ هیشتا ئەو یادە نەدەکرایەوە تەنانەت لە نامەکانی مس بیل دەردەکەوێ کە کاتی سەری سال ئەوان لە هۆرەکانی خوارووی عیراق خەریکی دروست کردنی دەولەتی عیراقین ،یەکەم باسی سەری سال لەنامەکانی (مس بیل) لە بروسکەیەکی شیخ محمود لە ١٩٢٢بۆ بەریتانیەکان لە بەغدا هاتوە ، هەر لەو نامە باس لەوە دەکا کە شیخ محمود لە ژێر فشاری ئەو کوردانەی کەوتبوونە ژێر کاریگەری بەریتانیا ئەو بروسکەیان بە شیخ محمود لیداوە ،ئەگەر بە واتایەکی نیشتمیانی و کوردایەتی بدوێین ئەوا ئەو یادە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان هێنراوەتە نێو کوردستان، ئەو لە کاتێکایە کە کەس دڵگرانی نیە کە برایانی مەسیحی لەکوردستان ئەو یادەی بە ڕێگەی تایبەتی خۆیان بکەنەوە و کردووشیانەوە.

٢. لە کوردستان ڕێزگرتنی برایانی مەسیحی و کەمایەتیەکانی تر لەچوارچێوەی ڕێنماییەکانی ئایینی ئیسلام بووە، بۆیە کەسایەتیە ئایینیەکان زیاتر ڕێزی ئەوانەی گرتووە، لە بەڵگەنامەی بریتانی ناوی (شێخ عبدالسلام بارزانی) واباو بووە بە (شێخی نەسرانی) ، هەروەها لە ڕاپۆرتی نێو بژی ویلایەتی موسڵیش باس لەوە دەکا کە لە نێو کوردستان ڕێزی مەسیحی و ئایینەکانی تر زۆر دەگیرێ، ئەو کاتی فەرهەنگی کورد ئەوەندە زال بوو کەسێتی وفەرهەنگی مەسیحی وتورکمان وعەرەب لە ناو کورد دەتوایەوە ، لە حکومەتی شێخ محمودیش وەزیری دارایی (کریم عەلەکە) مەسیحی بووە، تا ئەو ڕێزە لەچوارچێوەی ئایینی ئیسلام بووە ئەوا مەسیحیەکان و یەهودی هەموو لایەک خۆیان بە کورد زانیوە لەجل و بەرگ و ئینتما و هونەر و ... تاد ،نموونەش کەریمی عەلەکە و سلیوە و باکووری و دەیانی تەنانەت تورکمانی کەرکوک بۆ دەنگدان بە ملک فیێل بەو مەرجەی کە حکومەتی کوردستانی دروست ببێت (ئەوەش هەر لە نامەکانی مس بیل دۆزیتمەوە )، بەڵام کاتێ ئەو پێوانەیە گۆڕاو ڕێنمایی تری لائیکی هاتە جێی ئایینی ئەوان لە

کوردستان وەرچەخانێکی ترسناک هاتەدی و بەرەبەرە ئەو کەمایەتیانە خۆیان لە کورد جیاکردەوە، ئێستا مەسیحیەکان و هەتا یەزیدی و کاکەیش وا خۆیان لە کورد جیادەکەنەوە، بۆیە لەسەردەمی ڕێنمایی ئایینی بەشداری لە ئاهەنگی سەری ساڵ لەگەل برا مەسیحیەکانیان بریتی بوو لە (گەورەیی فەرهەنگی) و هاریکاری و لێبووردەیی، بەڵام ئەوەی ئێستا بریتیە لە (بچووکی فەرهەنگی – تقزم الثقافی).

٣. لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی، بەڵگەنامەیەکی دەگمەنم دۆزیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٣٤ و باسی لە هەندی ڕەوشەنبیر دەکا لە کوردستان و دەڵێ کاتی چاویان بە ئێمە دەکەوت یەکسەر باسی مەشروب و کتابەکانی ڤۆلتێر و جەژنی سەری ساڵ جارجار هەڵدەستان دانسیان دەکرد و پەیڕەوی ئەو فەرهەنگانەی ئێمەیان دەکرد، دوای تێگەیشتین (لە بەڵگەنامەکە واهاتووە) کە ئەم کوردانە بۆیە وا دەکەن کە ئێمە پێیان بڵێین ئەوانە ڕەوشەنبیر و کراوەن!

جا لە دوای سەدەی (١٩) و شکستی کوردی یەک لە دوای یەک بەهۆی ئەو دەردەی (تقزم الپقافی) ڕەوشەنبیر بووە چاوڵیکەر و تا ئەو ڕادەیە هەرچی لە دەرەوەی کوردستان بێت پێیان پێش کەوتنە و هەرچی موڵکی واقعی و مێژوویی کوردستانیش لەنەریت و فەرهەنگ و ئایینی ... پێیان دواکەوتنە، بۆیە ڕەوشەنبیران یادی سەری ساڵ لە مەسیحیەکانیش زیاتر دەکەنەوە، چەند نموونەیەک باس دەکەین ڕوون تر دەردەکەوی ئەو دەردە بەپێی توێژینەوەی ئەکادیمی چیە

نموونەی یەکەم: لە شۆڕشی نوی کە حزبە کوردستانیەکانی شاخ بە (پێشەوایەتی یەکێتی) پابەندبوون بە ڕێبازی مارکسیەت.

ئەویش هەڵوێستی بەرامبەر ئاین (افیون الشعوب) ه، بەتایبەتی ئایینی مەسیحی، لەسەر ئەو بنچینەیە جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان کە جەژنی ڕەسەنی کوردە بەبی دەنگی ڕەت دەبوو بەنان و ماستەکەی سبەینان، کەچی کە سەری ساڵ دەهات یادی دەکراوە،یەکەم یاد کردنەوەی بە ئاهەنگ لەسالی ١٩٨١بۆ ١٩٨٢ لە نیوزەنگ بە ئامادە بوونی مام جلال کرایەوە، ئاَ خۆ ئەوەش هەر یادێکی ئایینە بۆچی ئەوە دەکراوە ئەوەی ئیسلامی نەدەکراوە؟ ... هەر لە نموونەی دووەمی ئێستای دەسەڵاتی کوردی دا هەردوو یادی (..../١/١) و (١٢ ربیع الاول) یەکەمیان یادی لە دایک بوو (ح - مەسیح) و دووەمیان یادی لە دایک بوونی (ح - محمد)ه، بالێگەڕێین یەکیان ئ خۆمان و ئەوی تر ئ خەڵکی ترە، با هەروەک یەک بێت، کەچی دەبینین لەیادی یەکەم کوردستان دەهەژێ و پشووە و دانسە و پیرۆزباییە و شەو تا بەیانی ئاهەنگە وبودجەی بۆ دیاری کراوە... و سەرۆکەکانمان بروسکە بۆ یەکتر دەنێرن کەچی بۆ یادی دووەم بەبی دەنگی جگە لەوەی میللەت خۆی لەمزگەوتەکان چاڵاکی دەکا ئەگینا لەدەسەڵات کەس بە کەس ناڵێ جەژنت پیرۆز.

ئەوە مانای ئەوە نییە قەدەغەی یادی لە دایک بوونی (ح - مەسیح) بکەینەوە، ئەویش بابکری بەو پلەیەی لێی دەوەشێتەوە و خۆی وەسیەتی بۆ کردووە، بەڵام بۆ دووەمیش کە لێی دەوەشێتەوە.

٤. ئەگەر ئەو یادکردنەوەیەی کورد لە چوارچێوەی (هاریکاری گەلان) و (هاریکاری فەرهەنگی) بێت دیسان ئاساییە، واتە چۆن خەڵکی سوێد یان بەریتانیا یان روسیا جەژنێکی ئێمە دەکەنە جەژنی خۆیان ئێمەش وا دەکەین، بەڵام هیچ لەوانە نەجەژنە ئایینیەکانمان (ڕەمەزان و قوربان) نە جەژنە نیشتیمانیەکانمان (نەورۆز) هەر ناشزانن، ئیتر ئێمە بۆچی یادی جەژنی ئەوان بکەینەوە، ئەوە جگە لەوەی مانای (تقزم الپقافی) و (بە دووکەوتن و چاولێکەری) و (عیشقی یەک لایەنە) نەبی هیچ مانایەکی تر نابەخشێ ، زیاتر مانای ( شکست وگێلی فەرهەنگی) دەبەخشی.

٥. لە خاڵەکانی ڕابردوو دەردەکەوآ ئەو جۆرە یادکردنەوەوانەی وەکو (سەری ساڵ، ڤالانتاین و ..) بنچینەو ڕەگێکی کوردی نیە، داهێنانە و قازانجیشی لێنەکراوە، ئەوەی زیاتر شکستی سایکۆلۆجی دەسەلمێنی ، ئەوەیە کورد لە خاوەنەکانی زیاتر مشەوەش دەبی، لەیادی ڤالانتاین ئەوەی لە کوردستان دەبینرآ لە وڵاتانی ئەوروپیش نابینرآ، لێەوەیە بنەمای (ملکی ڕکپر من الملک) دێتەدی و مانایەکانی تر کە لە خوارەوە باسیان دەکەین زۆر ڕوون دەکاتەوە کە بریتین لە:

أ- گۆڕانی بەخێرای جل و بەرگ و سەر و سمێڵ و نەریت و... کە لەسەرکردەکان دەستی پآ کرد و گەیشتە بنکەکانیش بە شێوەیەک ئێستا شارەکانی کوردستان بپشکنی هەست ناکەی لە کوردستانی.

ب- ئەگەر شانۆگەریەک یان تەمسیلیەک بکرآ گوزارش لە دواکەوتوویی و غەشیمی بکا ئینجا بەرگێکی کوردی لەبەردەکەن، ئەوەش بەڕوونی ئەو مانایەی سەروو دەردەخا.

ج- لاسایی کردنەوەی لایەنی خراپی بیانی.

د- سەرەنجام وەستانی گەشە و وێران بوونی سیستەمەکانی کۆمەڵایەتی و تەعلیمی و فەرهەنگی و نەریتی تا دەگاتە سیستەمی سیاسی و ئابووری و ئیداری....

لەگەڵ زۆر خاڵی تر کە لەو دەرفەتە تەسکە هەر ئەوەندە بوارە هەیە.

## هۆکاروکاریگەریە فەرهەنگیەکانی

ئەو کورتە توێژینەوەیەی سەروو گوزارشە لەوەی کۆمەڵگەی کوردی بە (سەرکردەو بنکەوە) دووچاری دەردی تەقەزوم بوە،واتە خۆ بە بچوک زانین لە ئاست خەلکی تر ،بابزانین دەردی تەقزوم چیەو چۆن دێت و بۆچی هاتوە؟ توخمی هەرە بنچینەی تیایدا چیە؟ کاریگەریەکانی چیە ؟

**هۆکاری مەعقول:** دوو هۆکاری بنچینەیی هەیە دەکرێ پالنەر بێت خەلکی کوردستان سۆزێکی زیاتریان بۆ ئەو یادەهەبێت :١- ئەوەیە لەو سەردەمە کە کورد تووشی مەینەتی وئازارو ویرانی دەبێ جیهانی ئیسلامی یان بێدەنگە یان یارمەتیدەری زالمە ،کەچی دەنگی نارەزایی لە نێو جیهانی مەسیحیە . لە بەڵگەنامەی ئەمریکی (دۆسیەی پەیوەندی

دەرەوە ج E41969 . ١٩٧٢/٧/٥) دەڵآ یەکەم جار کریسمیس دانی بە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد هێناوە ،ئیستاش دەبینین کۆمەلێک مادەو بڕیارٍ هەیە لە نیودەولەتی هەیە بۆ مافی چارەنوسی گەلان وەک: مادەی (١) و مادەی (٥٥) ی میساق نەتەوە یەکگرتوەکان تۆمار کراوە، هەروەها بریارەکانی: ژمارە ١٥١٤ خولی(١٥)له١٤/دیسمبر/١٩٦٠، بڕیاڕی ژ:٢١٠٥ خولی (٢٠) له١٩٦٥ز، بریاری ژ:٢٦٢٥ خولی ٢٥ له٢٤/ئۆکتۆبەر/١٩٧٠، بریاری ژ:٣٠٧٠ خولی٢٨له ١٩٧٥، هەروەهابریاری ٣٣١٤سالی ١٩٧٤... لەهەمان ئەنجوومەن دەرچووە، ئینجا پیشوو لە ١٤ خالەکەی ویلسونی ئەمریکی لە ساڵی ١٩١٨ ولێدوانە هاوبەشەکەی بریتانی - فرنسی لە ١٩١٨، بنەماکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ی رووسی و شۆرشەکانی پیشوی ئەمریکی ١٧٧٦ و فرنسا ١٧٨٩ هاتووە،زیاتر لەوەش هەر ٣ مادەی ٦٢ و٦٣ و٦٤ی سیڤەر و مادەی ١٦ی ئینتداب بەسەر عیراق و..زۆری تریان هەیە بیکەنە بەلگەو منەت بەسەر بزوتنەوەی کوردایەتی ودەلین ئیمە بە پالپشت بەوانەو بۆ ئەوانە ئیش دەکەین ئیوە چیتان هەیە لە ئاین بۆ کورد؟!! تا ئیستا ئیسلامی لەکوردستان وەلامی دەولەمەندی بۆ ئەو گرفتە کوشندانە نیەلەسەر هەردوو ئاستی فقهی وسیاسی،هەرچەندە وەلام هەیەو فقهی رزگاری لە ئاینی ئیسلام ئاوا لاواز نیە ،گرفتەکە لەوەیە مونەزیری ئیسلامی بۆ (فقهی رزگاری) لاوازە..ئەگینا ڕەنگە پێچەوانە بێت. ٢- ئەوەیە جهانی مەسیحیە پیشڕەوایەتی شارستانی جهان دەکا ،ئەوان نەبن جهانی نوی دەوەستێ ،بە پیچەوانەوە جهانی ئیسلامی بەتایبەتی جهانی عربی کەم ترین داهینانی نیە ،لەو کاتە زەمینەو هاندانی (ڕووکەش) بۆ خەلکی عەوام زۆر کاریگەر دەبێت بە پیل وەها یادێک دا بچیتەوە ، بەلام لە قوولایی ستراتیژا دەردو تەسلیم بوونە نەک گەشە، وورد تر بریتیە لە شکستی فەرهەنگی.

## شکستی فەرهەنگی(تقزم الثقافی):

بەکورتی ئەو دەردە لە ئەنجامی کەلەکە بوونی شکستی زانستی وسیاسی وکۆمەلایەتی وسەربازی دێت ،دوای دووبارەبونەوەی ئەو شکستانە دەگاتە شکستی فەرهەنگی ،ئەو کاتی کەسایەتی وسایکۆلۆجیەتی ئەو تاکە (یان ئەو کۆمەلگەیە) لە دۆخێک دەبێ هەردەم سەرسامە بە هەلویست وفتواو ڕێبازو کاری بیانی ،کارو داهینانی خۆمالی لابچوک دەبێتەوەو ئەوەی خەلکی تری لا گەورە دەبێت ، لەوەوە کۆمەلگەیەکی لاسایی کەرەوەمان بۆ دروست دەبێت بێ داهێنان ئاساییە لەو دۆخەدا یادی بێگانەکانی لاگەورەوگرنگ تر بێت لە خۆمالیەکان.با بزانین بۆچی کۆمەلگەی کوردەواری وادووچاری ئەو نەخۆشیە بوە ؟ بەتەواوی دووچاری دەردی فەرهەنگی (تقزم الپقافی)بوە و قەبارەکەی چەندە؟.

کۆمەلگەی کوردەواری نزیکەی سەدەیەکە دووچاری داگیرکاری وشکست بوویتەوە لە ڕووی نیشتمانی وسەربازی ،ڕەنگی داوەتەوە سەر شکستی شارستانی وتەعلیمی ،دوای ئەوەی لە قۆناغی نوێی حزبایەتی زۆر بە پەڕەگریەوە بەرەو مەدرەسەر مارکسی ورۆژهەلاتی ڕۆیشتن دوای ئەویش شکستی هێنا،ئیستا بەرەو سەرمایەداری رۆژهەلاتین ،ئەو شکستە سیاسی وفکریانەش وای ئاویتە کرد کە دەردەکە بگاتە ئاستی فەرهەنگی کۆمەلگەی کوردەواری کە دوا سەنگەری بەرگری کەسێتی کۆمەلگەیە ، هەڵبەتە ئەو دۆخە ئاسایی نیە بەدەگمەن لەنێو گەلانی جهانی تر نمونەی وا هەبآ، ئەو دۆخە لە (فەرهەنگی دەروونی سیاسی) پێی دەوترآ (تقزم الثقافی) کە لە کۆمەڵێک (تقزمی) تر دێت (تقزم العلمی)، (تقزم الفکری)، (تقزم السیاسی)، (تقزم الحضاری). بەرە بەرە دەگاتە بارە هەرە کاریگەریەکەی ئەوەندە پتەو دەبآ دەبتە (ێدمە الثقافیە) و (انصار الثقافی) لەکۆتاییدا دەردی (تقزم الثقافی) لێ

بەرهەم دێت، ئەوەش کۆمەڵێک هۆ و پاساوی خۆی هەیە، گرنگ ترینیان ئەوەیە لەدوای مەینەتی کورد لە ١٩٠٨ بەدواوە شکست لە کرۆمۆسۆمەکانی تاکی کورد گیربووە،کەمتر متمانەی بەخۆی ماوە،ئەوە دەردی میلەتانی ژێر دەستەیە ، کاریگەری سیاسی و دەروونی و فەرهەنگی قووڵی بەجآ هێشتووە، بۆیە لای کۆمەڵگەی کورد وادەرکەوتووە هەرچی لەدەرەوەی کورد بێت مەزن و گرنگ و پتەو بەچارەنووسە، هەرچی لای خودی کوردیش بێت بچووک و دەڤەری و لەرزۆک و بآچارەنووسە، تا وای لێهاتووە شەرمی پآبێت، بۆیە دەبینین ئینتمای نیشتمانی و نەتەوەیی و ئاینی و فەرهەنگی لاواز بووە، بەخێرایی دەگۆڕێن، بەخێرایی جل وبەرگ و دیمەنی خۆیان دەگۆڕن، زمان و نەریتیان دەگۆڕن، نەتەوەیان گۆڕی، هەتا ئاینیش دەگۆڕن.

ئەوەیە (تقزم الثقافي)، هەربۆیە دەبینین هەتا ئەو ساتەش هیچ تەیار و مەدرەسەیەکی عەلمانی نادۆزیەوە لەسەر ڕێبازی زانا و ناودارێکی کوردستانی بآ، بۆیە باسی کەلتوور و نەریتی کوردستان بەنێگەتیڤی دەکرآ، خۆ لە فکر و فەلسەفە و تیۆری سیاسی بەتایبەتی لە مارکسیەت، مام جەلال گەلێ زیرەک و داهێنەر و بلیمەتێکە بەدەگمەن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی عەرەب بە ئەندازەی ئەو بیریارە شارەزا هەبآ، کەچی تەیارە عەلمانیە کوردستانیەکان بەهۆی دەردی (تقزم) هەریەکە لە هۆشی مین، ئۆگستینیتۆ، ترۆتسکی، ماو.. هەتا (ڕەوتی کۆمەنیست-کوردستانی باشور) بەو دواییە کەسی وایان دەست نەکەوت (منێوری حکمەت)یان کردە پێشەوا، چونکە کورد نەبوو (فارس) بوو، خۆ (عبدالله ئۆجەلان) مارکسیەتی واقعی و شۆڕشگێڕتریش بوو،نوێنەرایەتی دۆزێکی هەقیش دەکا بەڵام کورد بوو پێی تێرئاو نەبوون.

ئەو دەردە ئەوەندە کوشندە و خەستە تاڕادەیەک بەشێکی ئیسلامیەکانیشی گرتۆتەوە، زۆربەیان لە گفتوگۆ پاڵپشت دەکەنە سەر زانایەکی غەیرەکورد،هەروەها ڕەچەلەکی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی کوردستان دەدەنە پاڵ ئیخوان یان فکری بیانیەک کەچی دەتوانین بڵێین ئیسلامی سیاسی (بەزاراوەی باوی ئیستا)یەکەم جار لە کوردستان لە سەر دەستی نەوڕەسی سەری هەڵدا، کە لەخانەی خۆی باسیان دەکەین..

کۆمەڵگەی کورد ڕاستەوخۆ لەو دەردە بەرپرسیار نیە، بەڵکو مونەزیرەکانن، ڕەوشەنبیرەکان و تا دەگاتە سەرکردەکان هەروەک لە ئایدیۆلۆژیای حزبە کوردستانیەکان دەردەکەوێ کە لە خوارەوە زیاتر ئەو بابەتە ڕوون دەبێتەوە .

## دەردی لاسایی و پاشکۆیی عەقلی کوردی

ئەوەی ئێستا سەرنجێکی بەدیقەت بداتە حزبە کوردستانیەکان) عەلمانی وئاینیەوە)بە ناوو ناوەڕۆک و هەڵس و کەوت و ناوی ڕۆژنامەو جۆری ئایدیۆلۆجیا و هەتا جۆری گوتاری سیاسی.. دەبینی لاسایی کردنەوەیەکی پەتی بیانیە بآ داهێنان،سەردەمێک حزبەکوردستانیەکان بەئایدیۆلۆژیای ڕۆژهەلاتی سەرسام بوون تەنانەت ناوو دروشم وبلاوکراوەورۆژنامەکانیشیان کت ومت لەوان وەرگرتبوو، با ناسنامەی هەندێ حزب و ڕەچەلەکی یاخود بزانین لاسایی کێ کرایتەوە : لەکوردستان حزبی سوشیالیستی یەکگرتوو هەبوو لاسایی حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی ئەلمانیای ١٩١٩ بە سەرۆکایەتی روزا لوکسمبورگ ،دوای حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی فرنسی ١٩٦١دروست بوە، حزبی

زەحمەتکیش وکریکاران ورەنجدەرانمان هەبوو ئەوەتا ناوەئەسلیەکانیان: ،حزبی زەحمەتکیشانی ئەلبانی،کۆمەلەی رەنجدەرانی لاوس . پاسۆکمان هەبو ناوەکەی لەحزبی سۆشیالیستو پاسۆک لە یۆنان وەرگیراوە، پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان هەبوو ئەوەتا ناوو ناوەڕۆکی لە پارتی کاری سەربەخۆی کۆریاوەرگیراوە بە سەرۆکایەتی کیم ئیل سونگ، لە کوردستان ڕەوتی کۆمەنیست هەبوو ئەوەش لە ڕەوتی کۆمەنیستی ئیتالیاوەرگیراوە،پارتی گەل ودوای پارتی گەلی دیموکراسیمان هەبوو ئەوە لە پارتی گەلی ئەفغانستان وەرگیراوە کە لە ١٩٤٦ دامەزراوەلە سالی ١٩٢٠ (حزب الشعب السوری)یش هەبوە، پارتی گەلی تورکیاش هەبوولە سالی ١٩٦٢ دروست بوو ،پارتی کریکارانی کوردستان(پ ک ک)  لە جیهانی شیوعی زۆر بلاوە پارتی کریکارانی بلجیکی لە ١٨٨٥ دروست بوە،پارتی کریکارانی مەجەری لە١٩١٨ دروست بوە، پارتی کریکارانی ڤیتنامی پارتی کریکارانی ئەلبانی ، پارتی کریکاران لە بریتانیا لە١٩٢٣ دروست بوە بەلام ئەوەی کوردستان لاسایی ئەو نیە ،کەچی هەمو پارتە کریکارەکانی تر لە ناو چوون تەنها ئەوەی بریتانیا ماوە...، با بڕوانینە (ی.ن.ک)  کە پێشەنگی زۆربەی حزبە کوردستانیەکانی ترە ، زۆربەی حزبە کوردستانیەکانیش لاسایی کەرەوەی سیاسی و فکری و فەلسەفی و ئیداری .. ئەون بەچاک و خراپیەوە، کەچی ئەگەر زیاتر لێی وردبینەوە دەبینین ئەو لەپێش دا لەو دەردە ئالآوە، با سەرنج بدەینە ناوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و پێکهاتەو ئەو تیۆرەی لەسەری دەڕۆیشت و وا لەسەری دەڕوا، وەک ئەزموونێکی نوێیە لە کوردستان، کەچی دەبینین ئەوەش کت و مت لاسایی کردنەوەی ناوو ناوەڕۆک و ئەزموونی هەندآ حزبی جیهانە، لەوانە:

١. ئەزمون وناوی (یەکیتی نیشتمانی سودانی(سانو) کە لە ١٩٥٨ دروست ببو  بە سەرۆکایەتی جوزیفئودوهو ،دروشمی دیموکراسی بۆ سودان وفیدرالی بۆ خواروو بوو .

٢. ئەزموونی( یەکێتی نیشتمانی ئەنگۆلی)کە لە سالی ١٩٦٦ دروست بووە بە سەرۆکایەتی سافیمبی(لە دایک بووی ١٩٣٤) .

٣. ئەزموونی یەکێتی نیشتمانی زیمبابۆی(زانۆ)کە لە (زابۆ) جیا بۆوە لە سالی ١٩٦١،لە سەرەتا ڕێبازێکی مارکسی ماویانەی هەبوو .

٤. ئەزموونی یەکێتی نیشتمانی کینی لە ساڵی ١٩٦٠ دروست بوو لە ٣ بالڕ (بزوتنەوەی سەربەخۆی کینیا، کۆمەڵەی هەڵبژاردە، هێڵی گشتی ئەفریقیا) ئەوە کت ومت و ناو و ناوەڕۆکی یەکێتی  کە پێکهاتبوو لە سآ بالڕ (بزوتنەوە، کۆمەڵە، خەتی گشتی.(

٥. ئەزموونی (اتحاد الوگنی عێراق- یەکیتی نیشتمانی عیراقی)بەسەروکایەتی عبدالفتاح ابراهیم لە سالی ١٩٤٦ وەک رەوتیکی مارکسی لەژێر پەردەی یەکیتی هیزە نیشتمانیەکانی نەتەوەگەری وبەعسی وشیوعی.

بڵاوکراوەکانی یەکێتیش هەمدیسان لاسایی بوو،(شرارە) یەکەم بلاوکراوەی بوو ئەوالاسایی ئەو شەرارەیە بووەکە(لینین)دەری دەکرد لە سالی ١٩٠٠بەناوی (ئایسکرا)[٢] ، هەروەها ریکخراویکی ئەرمەنی بەناوی (یەکیتی قوتابیانی سوشیالیستی دیموکراسی هەشناقی)لە سالی ١٩١١دەری دەکردبە ناوی (غایدز- واتە- شرارە).

با زیاتر بەلای رۆژنامە کوردیەکان بچین، رۆژنامەکانی کوردستان سودیان لەو ناوانە وەرگرتوە: ڕیا تازە – ئەرمینیا،ڕێگای گەل –کۆریا،تورکیای نوێ،برایەتی-هندستان،خەبات-فلستین،ئالای ئازادی-لبنان،اتحاد-زبیان..با کەمێک هەلوەستەلە ڕۆژنامەی (یەکسانی)دەست پێ بکەین کە لەلایەن کۆمەڵە ئافرەتێکی عەلمانی چەپی لە کوردستان لە ساڵانی دوای ڕاپەڕین دەردەچوو.. ئەوە کت و مت بەناو و ناوەڕۆک و مەبەستەوە، لاسایی کردنەوەی ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانی بوو بەناوی (گلایخایت- واتە یەکسانی) لەساڵی١٨٩١ز دەردەچوو، واتە پێش ١٠٤ ساڵ لەمەوپیش، ئەویش کۆمەڵێک ئافرەت بەڕێوەیان دەبرد، ئەو ئەزموونەی گلایخایت ٢٥ ساڵی خایاند و شکستی هێنا، جا سەرنج بدە ئێمەی کورد هاتووین لاسایی ئەزموونێکی شکست خواردووی پێش ١٠٤ ساڵ لەمەوبەری ئەوروپی دەکەینەوە...ئەوەیە شکستی فەرهەنگی (تقزم الثقافی)، ئەودەردە تایبەت نیە بە چین وتوێژو لایەنێک بەلکو زۆربەمانی گرتۆتەوە هەتا موفەکیرە گەورەکانیشمان، مام جلال کە گەورەترین مونەزیری ئەو سەردەمەیە لە بەراوردی نیوان ئیسلام وسۆشیالیستی ڕای وایە کە سۆشیالیست بەهەشتی پێیە بۆ ئەو دنیایە ، هەرچی ئیسلامە دەڵێ خۆ ڕاگرن بەهەشتان لە دوارۆژ پێ دەدەم[٣].

ئەوە دەقی ڕای ئەنجلسە لەبارەی مسیحی دەڵێ : (أن الفارق بين الحركتين يتمثل فى أن المسيحيين الأوائل قد نقلوا الخلاص إلى الآخرة بينما تتصوره الاشتراكية فى هذا العالم الدنيوی)[٤]، هەمان بەراورد موفەکیری گەورەی کورد عبدالله ئۆجەلان دەیکا دەڵێ: پیغمبەرو ئیمام علی لە ئیمە سۆشیالیزم تر بووینە ئەوە دەقی وەسفی (د.جورج حنا) یە کەدەڵێ پێغەمبەرەکان سۆشیالیستی بووینە پیش ئەوەی سۆشیالیستی بیتە کایەوە[٥]، هەردوولاشیان لە مانیفیستەکەی (مارکس وئەنجلس )بۆ جاڕدانی شیوعی ووتویانە: سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەکاتی خۆی سەرکەوتن بوو بۆ مێژووش[٦] ، لەوەوە زیاتر ئەو دەردە شۆڕ بوویتەوە بۆ خوارەوە، کتیبی سەگوەڕی محمد موکری کە لەساڵی ١٩٨٢دەرچوو شۆڕشی کوردی بە (سەگوەڕ)شوبهانبوو .. لە بنەچەدا ئەوە کت ومت لە (بروتوکولات حكماء الهيون - بروتوكول رقم:١٩) شۆرش بە سەگوەڕ دەشوبهێنی: (ان الثوره ليس أكثر من نباح كلب على فيل، ففى الحكومه المنظمه تنظيماً حسناً من وجهه النظر الاجتماعيه لا من وجهه النظر إلى بوليسها، ينبح الكلب على الفيل من غير رێ يحقق قدرته. وليس على الفيل الا ان يظهر قدرته بمپل واحد متقن حتى تكف الكلاب عن النباح، وتشرع فى البێیێەبرژنابها عندما ترى الفيل) ، هەمو ئەوانە بریتیە لە تەقەلای تاقی (تاقیکراوەی شکست) بکەینەوە،لایەنی عەلمانی کورد لەسەرەتادا بناغەیەکی چەوتی بۆ کوردایەتی وێنە کرد، کورد گیرۆدەی دەستی عەلمانی وئیتحادولتەرەقی وکەمالی بون، کەچی ئەوان سەرسام بون بەمەدرەسەکانی ئەوان، ئەوەتە سەرچاوەی هەمو حزبە کوردستانیەکانی(عەلمانی) بۆ (پ د ک)دەگەڕێتەوە، ئەویش بۆ (هیوا)، هیواش بۆ(حزبی دارکەر) بە سەرۆکایەتی رفیق حلمی، با بزانین ناسنامەی ئەو حزبە لە کێ ساغ دەبتەوە؟ دارکەر کت ومت کۆپی (کاربۆناری ئیتالیایە)[٧] ،(تورکیای لاو) لەچاو کاربۆناری کرایەوە،دوایش (ئیتحادولتەرەقی) دژ بەکوردی لەتورکیا هێنا ئارایەوە، چ لەوە چەوت تر هەلسیت موعجیب بیت بە دوژمنت ولاسایی داگیرکەرت بکەیتەوە،چ لاسایەک ئەزمونی شکست خواردووی نیوان ١٨٠٧-١٨٣٠.

دیسان سەرنج بدە بەو ماوە کورتە، زۆربەی حزبە کوردستانیان لەڕووی ئایدیۆلۆجیا چەندین ئەوبەرو ئەوبەریان کردووە لە لاسایی کردنەوە، تاڕادەی پێچەوانە، بەووردی دەری دەخا کە ئێمەی کورد بەرهەمی فکری

خۆمان نیە، بەدوای پآخوستی خەڵکی ترین لەدوورەوە، بۆیە گەڵێ جار دەگەینە کۆلە ڕێ، گەڵێ جاریش کارەسات، جاریش وایە ئەوەندەی ڕۆیشتووینە دەگەڕێینەوەو لەعنەت لەو ڕابوردووەمان دەکەین.

جا دەردێکی تری تەقەزوم ئەوەیە کە حزبە کوردستانیەکانی (بەشی عەلمانی کردوویانە) ئەوەیە لەنێو ئەو ئایدیۆلۆجی و تیۆری سیاسی و فەرهەنگی و ئەزموونەکان زیاتر لایەنە نێگەتیڤەکانیان هاوردووە نەک پۆزەتیڤ ،ئەگینا لاسایی لایەنی ئیجابی خراپ نیە، سەرنج بدە لە ئەزموونی بزوتنەوەی شیوعیەت، ئۆرۆشیوعی چاکتر بوو لە ستالینیە شیوعیەکان، کەچی مارکسیەکانی کوردستان ستالینیانە بوون، ووردتر بچینە ناو توێژێکی هەرە بابەتی تر، ئەو تەیارەی پێیان دەووتن وجودیەکان، لەنێو وجودی جهانی تەیاری سارتەری زیاتر بآبڕوا و توند و ڕەشبینە، تەیاری (کیرکیجاردی) زیاتر بەلای میان ڕەویە.. کەچی وجودیەکانی کوردستان سارتەری بوون نەک میانڕەوەکە.

بە هەمان شێوە وا ئێستاش کە ڕوویان وەرگەڕاوە بە ١٨٠ پلە ئەوەی ٣٠ سالڕ زۆر بەخەستی لەدژی بوون ئەمجارە بووەوە سەرمەشقیان و دیسان لەو سەرمەشقیە نوێیەش لای سەلبیەکانیان وەرگرتووە، خۆ ئەو عەلمانیەتەی رۆژئاوا یەک شت نیە، هەر ئەو عەلمانیەتە سیستەمی ئیمپریالیزم وهەردوو جەنگی جهانی و تۆرانی ونازی وفاشی و شۆڤینی وبەعسیەتی هێناوەتە بەرهەم ..( ئەو عەلمانیەی ئیستا لە کوردستان پەیڕەو دەکری ئەندازیارەکەی (مۆسۆلینی سەرۆکی بزوتنەوەی فاشیە ) لە سالی ١٩٢٩ جارێ دا کە ریکەوتنی لەگەل پاپا کردووە بۆ دابەشی دەسەلاتی ئاینی ودونیایی بەو شیوەیە :مرۆڤ لەبوونیەوە تامردن بۆ مۆسۆلینی بیت لە دوای مردنیش بۆ پاپا بیت هەتا قیامەت!!) ، سەرەرای دەردی لیبرالیەتی کۆمەڵایەتی، بازاڕی ئازاد، چینایەتی و ڕەگەزپەرستی، دوورە ئاینی و ئەخلاقی ..وەک لایەنی سەلبیەکەی، لایەنی ئیجابیەکەی ڕۆژئاواش بریتیە لە دیموکراسی وپرۆسەی سیاسی، مەدەنیەتی، دەستگۆڕی دەسەڵاتی، تەکنەلۆجیاکەی، ئازادی ڕادەربڕینی، سەروەری یاسا، خۆشەویستی ووڵات.. جا با وردبینەوە دەبینین عەلمانیەتی کورد هاتووە لە دیموکراسی و ئازادی و دەستگۆڕی دەسەڵات و زانست و تەکنەلۆجیا ڕاستەقینەکە لای داوە یان تەنها ناوی وەرگرتوە، یەخەگیری باقی سەلبیاتەکانی تر بووە هێناویەتی بەسەر کوردی دا پەیڕەو دەکا،وازی لە عەلمانیەتی فرنسی وبریتانی وئەمریکی و..هێناوە یەخەگیری عەلمانیەتەکەی ئیتالیا بوە.

ئەگەر چی ئەزمونی حزبە ئیسلامیەکان ساوایە کەچی ئەوانیش لە دەردی لاسایی دەرنەچون،لاسایی ئەوان لە ئەزمونی عەرەبی ،لە کوردستان حزبی ئیسلامی بە ناوی نەهزەو (جماعە-کۆمەل) وبزوتنەوە ئەوناوانەش لە نەهزەی تونس وتاجیکستان وەرگیراوە ،ئەوانەش لە حزبی نەهزەی ئیسلامیان وەرگرتوە کە لە ١٩٢٠ لە شۆرشی بیست چالاک بوو،کۆمەل لە کۆمەلی پاکستان وبزوتنەوە لە بزوتنەوەی ئیسلامی فلستین و...لاسایی کردنەوەکە تا ڕادەی کەسێتیش بوە.

بەوشێوەیەش وا ئێستا بەبێ بەرنامە چووینە نێو عەولەمە وەک ئافرەتێکی پاکی نەشارەزا لەناکاو وبەبێ کۆنترۆل بکەویە شارێکی وەک ئەنکەرە، هەموو میلەتان بەبەرنامەیەکەوە چوونە نێو عەولەمە کەنەبێتە دەرد بۆیان، چونکە عەولەمە چاک وخراپت پێکەوە بۆ ڕاپێچی ناو ماڵ ومیللەتەکەت دەکا، مەرج نیە نەریت وفەرهەنگی ووڵاتانی

تکنۆلۆژیدار هەمووی ئیجابی بێت، زۆر لایەنی سەلبی وای لەگەڵە بە پێی یاسایی وئاینی پێیان پاک نەکرایتەوە وەک فایرۆس دێت، پێویستە دەسەڵاتی کوردی ووریا بێت لایەنەچاکەکان وەرگرێ نەک خراپە .

هەڵبەتە ئەو دۆخە لەنێو ڕۆژهەڵات و هەمو جیهانی ئیسلامی نیە، هەتا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش، ئەوەتا هەر لە نزیک خۆمان، ئەو دەردە زیاتر لەنێو دەسەڵاتدارانی عەرەب هەیە، دەسەڵاتدارانی کوردیشتی گرتۆتەوە.بۆیە ئەوانە زیاتر یادی سەری سال لە چوارچێوەی (دەردی تەقەزوم ودەردی لاسایی) دەکەنەوە.

## شکستی فەرهەنگی و قەیرانی عەقلیەتی کورد

لەسەروو بۆمان دەرکەوت شکستی فەرهەنگی ولاسایی پەکی گەشەو داهێنان دەخەن ،میلەتێکی پاشکۆی لێ دروست دەبێت ، زۆر بەخێرایش قەیرانی عەقلی لێ سەر هەلدەدا ، ئێمە زۆر جار باسی قەیرانی عەقلی عەلمانی کوردمان کردوە پیشوو ترو هەم لەسەرووش ،ئەگەر ڕەوشەنبیری ئیسلامیش ئەو قەیرانەی هەبوو ئەوادەتوانین بلێین قەیرانی عەقلیەتی کوردی هەیە، واتە زۆربەمان قەیرانی تێگەیشتن وتێڕوانین وگەشەمان هەیە ،ئەوەش حوکمێکە بوێریەکی زانستی زۆری دەوێ ،بۆ کورت کردنەوە بیریارە گەورەکانی عەرەب ئەو بوێریەیان کردوەو باسیان لە قەیرانی عەقلیەتی عەرەبی کردوە لەلایەن (محمد ئەرگۆن،محمد عابید جابری ،نێر حامد ابوزید ...) پیشوو تریش ابن خلدوون ودوایش علی وردی ئەو یاسەیان کردوە، بەلام کەم تر ئەو قەیرانانە لە نێو میلەتانی تری رۆژهەلاتی بەدی دەکرێ ،ئەگەر کورد پاساوی داگیرکراوی هەبێ بۆ بوونی ئەو قەیرانە ئەوا بۆ برایانی عەرەب زۆر قوڕسە پاساوێکی لۆژیکی وابدۆزنەوە کە چارەسەری بدا ، قەیرانی عەقلیەتی کوردی (مەبەست هەموو نیە مەبەست زۆرایەتیەکەیەتی) یەک سەرچاوەی نیە سەرەکیەکەی دوو سەرچاوەیە ،عەلمانیەکان زیاتر پاشکۆی لایەنی سەلبی رۆژئاواایین ،ئیسلامیەکانیش پاشکۆی عەقلی عەرەبین کە خۆی لە قەیراندایە ، خۆی لە ژێر ئینتدابە واتە ئەو عەقلە کوردیەی کەوتۆتە ژێر کاریگەری عەقلی عەرەبی کەوتۆتە ژێر ئینتدابی ئینتداب ، ئەوەی یەکەم چارەی قوڕسەو ئالۆزەو هەندێ ڕەگی دەچێتەوە سەر عەولەمەو ڕەهەندە دەولی و ژیاریەکان ،بەلام ئەوەی دوەم ئەگەری چارەسەری ئاسان ترە بۆیە لەسەر ئەوەی دوەم دەوەستین :

ئەو ئاین پەروەرانەی کورد کە کەوتۆنە ژێر کاریگەری عەقلی عەرەبی ، ناتوانێ عەقلی عربی وعەقلی ئاینی لێک جیاکاتەوە،هەر میلەتێک بەو عەقلە کاریگەر بێت ئەویش لە قەیران ودواکوتندایە،نمونەی ڕوون پاکستان وئەفغانستان وتاڕادەیەکیش کوردستان،دەبینین باقی وولاتانی ئیسلامی کە عەقلی ڕاستەوخۆ تەفاعول لەگەل ئیسلام دەکا لەگەشە دایە ،میلەتی کوردو ئەفغان وپاکستان لە ڕێی عەقلی عربیەوە تەفاعول لەگەل ئیسلام دەکا کەوتونە نێو قەیران وپەرتەوازەیی ودوا کەوتن.

عەقلی عربیش خۆی لە گەورەترین قەیراندایە ،کیشەکە بەوە زیاتر ئالۆزو ئاویتە دەبێ کە قەیرانی عەقلی ئیسلامی کوردستان لە ژێر کاریگەری قەیرانیکی تری سەختی عەقلی عەرەبی قەیراناوی بێت،عەقلی عربی لەو کاتە

توشی قەیران بوە کە ویستویەتی عروبی وئیسلامی تیکەل بکا تا فەزل بەخۆی بدا، ناشکرێ، چونکە عروبی لە کۆمەلە فاکتەرەکانی ستونیەو ئاینیش لە کۆمەلە فاکتەرەکانی ئاسۆییە،ناچار دەستکاری دەقی دەوێ ،لە ئاینیکی مرۆڤایەتیەوە وەری چەرخێنە ئاینیکی ڕەگەزپەرستی،تا فەزلی عرب بەسەر میلەتانی تر بەرجەستە بێت بەبێ بەرگری، ناچار دەستکاری مێژووشی دەوێ وکردویانە،تەعریبی مێژووی دەوێ وکردویانە، ئیترلەو تەقەلایەوە قەیرانی عەقلی عربی دروست بوە، لەگەل نەمانی دەسەلات لەدەست عرب خەست تر بۆوە،ئەو قەیرانە نەیتوانیە بگاتە دەقی ئاینی بەلام بە توندی گەیشتۆتە فقە ومێژوو وڕوانگەی سیاسی،وای کردوە میلەتی عرب لە جیهان دوا کەوێ،بەو قەیرانەش هاتونە دنیای نوێ، بەو ناسنامەش هاتنە نێو عەولەمە،سایکس پیکۆو بەلینی بلفۆروسیستەمی ئینتدابی١٩٢٠، دەسەلاتی عربی دیکتاتۆر یەکجاری قەیرانی بۆ دروست کردن،ئەو ڕۆژەی کەتەنها عەرەب ڕازی بوو بە سیستەمی ئینتداب (کە بە پێی مادەی (٢٢)ی بەشی (١) عەهدی عوسبە دەرچوە ،پەرەگرافی ٤ )[٨] و دانی بەوە نا کە ئەوان قوتابین وئینگلیزو فرنسیش مامۆستان ئەوا عەقلی عربی لە قەیرانا پەڕیەوە بۆ دیل وپاشکۆیەتی ،چونکە بە پێی بنەمای (ملتۆن) بەریتانیا مامۆستایەو عەرەبیش دەبتە قوتابی، دەقی بنەمای (ملتون): ((لا تدع بريطانيا تنسى رسالتها فى تعليم الأمم كيف تعيش))[٩] .

لەسەر ئەو بنچینەیە وولاتانی عەرەبی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دروست بوە ، ڕازین بە مەبەستەکانی سایکس پیکۆو بەلفۆر کەبریتیە لە پەرتەوازەیی ودوورکەوتنەوە لە ئاین وپاشکۆیی ودواکەوتەیی ...،ئیتر لەو کاتی تا ئیستا وولاتانی عەرەبی لە قەیرانی هەمەجۆرن و عەقلی عەرەبیش لە قەیرانی سەختدایە ،بۆیەش تاکە ناوچەیەکە کە پڕۆژەی جیهانی بۆ چاکسازی بۆ ئامادەکراوە بریتین لە:

١. پرۆژەی ئەوروپی بۆ چاکسازی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست (کۆنگرەی برشلۆنە ١٩٩٥)
٢-پرۆژەی( مبادره الشراكة كۆلن پاول –امريكا - ١٢ديسمبر٢٠٠٢ ).
٣. پرۆژەی ( ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی گەورەی ئەمریکی لە ٢٠٠٤ ).
٤. پرۆژەی (المبادرة الألمانيه ).
٥. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە ٢٠٠٤ز. ج بۆشی کوڕ .
٦. ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی فراوان ئەلمانیا و فرنسا . ٢٠٠٤ ز .
٧. پرۆژەی ئیسرائیل (شمعون پيرس- الشرق الأوسط الجديد) .
٨. پرۆژەی جامیعەی عربی(دیکۆمینتی ئەسکەندەریە)...

لەسەر هەندێ لای ئەو قەیرانانە هەلوەستەیەکی خێرا دەکەین: وولاتانی عربی بەو هەمو داهاتە سروشتیەی کەچی لە ڕووەکانی تەکنیکی وزانستی وسیاسی ویاسایی وتەعلیمی ..زۆر لەدواوەیە، لەکتیبی ( حتميه التغير –فى الشرق الاوسط) واهاتوە : منز إستقلال العرب الشىء الوحيد الزى قدمه هو ١-الحروب ٢-التوتر بين العالم العربى والعالم المتحجر ٣-مشاكل الداخليه ٤-عدم وجود الحريه ٥-حكم قبلى ٦-الگريق الوحيد للتغير هى إما الانقلابات ڕو الاغتيالات ٧- سياسه فيها يساوى عنف .. ،لە ڕاپۆرتێکی (بەڕێوەبەری نەخشەی سیاسی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی لە ژێر ناوی : نحو ديمقراطية شاملة فى العالم الإسلامي ٢٠٠٣-کە پرۆژەی ڕۆژهەلاتی ناوەراستی گەورەی ئەمریکی

پشتی پێ بەستوە) دەڵێ ئیسرائیل تاکە وولاتێکە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەتوانین پێی بلێین دیموکراسی، لە پرۆژەکەی ئیسرائیلیش(شمعون پیرس) لە کتیبەکەی (الشرق الأوسط الجدید) وبنیامین نەتەنیاهۆ لە کتیبەکەی (مکان تحت الشمس) )هەمان شت دەڵێ، ،لە راپۆرتی (التنمیه الانسانیه العربیه –کە نەتەوە یەکگرتوەکانیش پەیرەوی ئەو راپۆرتەیان کرد) هاتوە :کەم ترین ئازادی لە جیهان بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست(وولاتانی عەرەبی) دەگەرێتەوە، ١٤ ملیۆن بێ ئیش وکار وبرسی هەیە، لەو ناوچەیەگەشە زۆر لاوازە بەبەراورد لەگەل خراپ ترین وولاتی ئەوروپی (ئیسپانیا) دەبینین ٢٦٠ ملیۆن عەرەب بە ئەندازەی ٤٠ ملیۆن ئیسپانی بەرهەمیان نیە ،هەتا ئەو بەراوردەی عرب بە ئیرانیش لاوازە، جگە لەنەوت تەنها ١%ی بازاری جیهانی کەل وپەلی رۆژهەلاتی ناوەراستی تیدایە،لە دەست پیشخەریەکەی کۆلن پاول هاتوە :رۆژهەلاتی ناوەراست خاوەنی رەسەنی زانست وهونەرو شارستانین کەچی ئیستا میلەتانی ئەو ناوچە هەژارن لە زانستی سیاسی وئازادی وئابوری ...،حکومەتەکانیشیان بریتین لە دیکتاتۆر ،١٠ ملیۆن مندال ونیوەی ئافرەتانیان نەخوێندەوارە،سەرجەم ٦٥ ملیۆن نەخویندەواری لیبەبە پێی راپۆرتی (التنمیه البشریه لعام ٢٠٠٢) دەکاتە ٤٠%، بۆ سالی ٢٠٢٠ نزیکەی ١٠٠ملیۆن ئامادە دەبێ بۆ کار کەچی دەولەت دەتوانی ٦ملیۆن وەرگری ، بە پێی راپۆرتی (التنمیه البشریه لعام ٢٠٠٢) سەرجەم ٥١%ی عەرەب دەیەوێ کۆچ بکا لە وولاتی خۆی، لە تعلیم زۆر خراپ ترە بەرهەمی کتیب تەنها ١% پر دەکاتەوە،تەرجەمەی کتیب بۆ یۆنان ٥ جار هەندی عربیە، زانیاری وداتایەکی زۆری تر لەو پرۆژانەو لە توێژینەوەی تر هاتوە کە رۆژهەلاتی ناوەراست بەو فۆرمە گەشە ناکا،بەلکو زۆربەی وولاتانیان لە پۆلی (الدوله الفاشله).

لەسەر ئەو بنچینە تیکرای بیریارەگەورەکانیان کۆدەنگن لەسەر ئەو شەبەنگە قەیراناویەی عەقلی عربی،زۆربەی مونەزیرو زاناوبیریاری عربی ئاینی لەو زەمینەوە (تصدیر)ی بۆچوونەقەیراناویەکانی دەکا،بەشیکیشی هەیە لەو قەیرانانە رزگاربوە،بەلام کەمایەتین وهەولی نامۆکردنیان دراوە بە زیندانی کردن و دوورخستنەوەو سزای تر، کەچی ئیسلامی کورد وەک چۆن عەلمانی کورد لاسایی لایەنە سەلبیەکانی مەدرەسە عەلمانیەکانی جیهان دەکاو توشی قەیرانی عەقلی سەخت بوە ئاواش بەشی هەرە زۆری ئیسلامی کورد کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو جۆرە عەقلە پرلە قەیرانەی عەرەبی،ئیسلامی کورد رازی بوە کە لەدوای ئەو عەقلەی عربی جێی خۆی بکاتەوە ،عەرەبی ئیسلامی بە پلە دووی موالی کۆن سەیری ئیسلامی کورد دەکا ، تەنانەت بە خۆی ئەو هەمو قەیراناویەی بەکورد دەڵێ تۆ بیرمەکەوە عەقلی عربی بەهێزترە من لە جیاتی تۆ بیردەکەمەوە تۆ تەنها لە خزمەتدابەو بەدوام کەوە،من چیم پێ باش بوو ئەو بۆ تۆش باشە،ئەگەر هەلەشم کرد ئەوا هەلەی من لە راستی تۆ دروست ترە ، بەو روانگەسەقەتە ئیسلامی کورد سەیری جیهان دەکا،چاوەرێ دەکا عەقلی عربی وێنەی دونیای بۆ بکێشی،دەریش کەوتوە ئەو وینانەی عەقلی عربی دروستی دەکا زۆر لەنگ وسەقەتە،وێنەی راستەقینەی جیهان نیە ،لەوەوە ئیسلامی کورد تووشی کاردانەوەی تایفی وتوندی ودەمارگیری ودابران وبێ ئینتمابی بوە بێ ئەوەی پیویستی پێبێت،جاروایە هەمو دنیای لێ دەبێتە دوژمن، تاجل و بەرگی خۆشی بێ ئەوەی هۆیەکەی مەعقول بێت،کە شایستەی نیە،بە دلپاکی وفەقیرحالی تووش دەبێ ، جاریش وایە دەگاتە ئەو رادەیەی تەرازوو وپیوەرەکان پیچەوانە دەکەنەوە دۆستی لێدەکەنە دوژمن ،سپی لێ رەش دەکەن ..بە پیچەوانەشەوە ، شیخ سعیدی و شیخ محمودو مەلامستەفاو تەواوی دۆزی کورد دەدەنە پاڵ پرۆژەی ئیستعمارو زایۆنی و وولاتانی عربیش پیشرەوی رزگاری وهەلگری ئالای ئاین ،شۆرشەکانی کوردستان ئینفسالی وئینگلیزی وروسی

بوە کەچی شۆڕشێکی خیانەتکاری وەک شریف بن حسین بە (ثوره العربیة الکبری) وەسف دەکەن ، با لەبارەی ئەسلی بابەتەکەمان نمونەیەک وەرگرین :ئێمە باسی ئەوەمان کرد کە یادکردنەوەی سەری سال بەو شێوە گوزارشێکی ڕوونی شکستی فەرهەنگیە ولایەنە عەلمانیەکان لێی بەرپرسیارن ،بەلام ئەوە مانای ئەوە نیە دژی بوەستی کە برایانی مسیحی بۆخۆیان ئەو یادە بکەنەوە ، کەچی عەقلی عەرەبی دەیەوێ بە کورد بڵێ ئەوە حرامەو دەبێ قەدەغە بکرێت ،ئیبن بازو ئیبن عوسەیمین ئەو یادەیان پێ حرامە بەلام یادی دروست بوونی دەولەتی سعودیەو قەتەرو عیراق وئوردەنیان پێ ئاساییە کەلەلایەن ئینگلیزو فرنساو ئاژانسەکانی یەهود دروست کراون ،ئەوەتا دەولەتی سعودیە بە پێی ڕێکەوتنی (قەتیف ١٩١٥)[١٠] لە نێوان عبدالعزیز بن السعود و برسی کۆکسی بریتانی کرا دژ بە خەلافەتی ئیسلامی ،کەچی ئەوە جەژنی نیشتمانیەو ئاساییە ..عەقلی ئیسلامی کورد دێت فتوای سەقەت لەوانە وەردەگرێ ڕق وکینە لەنێو پێکهاتەکانی کوردستان بلاودەکاتەوەو یەکپارچەیی نیشتمانی دەخاتە مەترسی ،کەچی کورد خۆی زاناو موفتی گەورەی هەیە، ئەگەر لە مەیدانی سیاسی وەک پێویست سەرکەوتوونەبووبن،بەلام لە مەیدانی فقهو فتوا بۆ کوردستان پێویستمان بە دەرەکی نیە، لەوانە (د زەلمی ،د محسن عبدالحمید،صلاح الدین بهاء الدین ،علی باپیر )...

ئەوەی دلخۆشکەرە خەریکە بە ڕوونی هەست بکرێ کە ئەو قەیرانە (ئیستراده) ولە ناخی ئیسلامی کورد ولە ناخی ئاینیش هەلنەقولاوە ،بۆیە ئومیدی چاکسازی وپەڕینەوە لەو قەیرانە مەحال نیە،دەرچوون لە ژێر ئینتدابی عەقلی عەرەبی (کە ئەویش لە ژێر ئینتدابی عەقلی ڕۆژئاواییە)هەنگاوی سەرەتایی بیناى عەقلی ئیسلامی کوردە، ئینجا نۆرەی چاکسازی وپرۆژەو تیۆری سیاسی دێت، کە سەرەتاشە بۆ چاکردن وشکست بە(شکستی فەرهەنگی) بهێنین تیایدا بوار بەگەشەی عەقلیمان دەکرێتەوە ،ئەو کاتی دەتوانین وەک غاندی گۆتەنی دەرگاو پەنجەرە بەسەر جیهان دەکەینەوە بەلام ناهێلین لە ڕەگ وڕیشەوە دەرمان بکێشن.

## پەراوێـــــــــــــــــوزەکان:

1 Longman new generation Dictionary- p112

١ . انجيل لوقا–اصحاح٢ اية(٨–١٣)

٢. له تەورات ووردتر ئەو بەروارانەی تیدایه ،ناوی پیغمبەرەکانی نیوان ئادەم تا نوحی تیدایه ئینجا بەرواری تۆفانەکەو کۆتایی هاتنی بەووردی تیدایه ، ئەو بەروارەمان له وەسیقەی سەربەخۆ بوونی ئیسرائیل وەرگرتوه که سالی ١٩٤٨ بەرامبەر ٥٧٠٨ی عیبری دەکا .

٣. موسوعة العربية العالمية – مادة : عيد الميلاد.

٤. له قورئان باسی (یوم الزینه) دەکا لەو ناوچه که جۆریك له ئاهەنگ ونمایشی سالانه کراوه ،سینۆهەی پزیشکی فیرعەونیش باس لەو رۆژه دەکا .

٥. بروانه : مەوسوعەی جودی ل ٣٧٢

٦. قاموس ئوکسفورد ئنکلیزی– عربی (ماده:کریسمس)ص١١٢ رۆژی ٢٥ دەکاته سەری سال.

٧. (تاريخ الطبری– ج١ ص٣٤٠،ص٣٥٥ .

٨. الكتاب المقدس–عهد القديم –سفر دانيال (٢٧ – ٩:٢٤)

٩. العراق فی رسائل المس بيل –ت: جعفر الخياط ص٤٧١

١٠. له ڕاپۆرتێکی (ئیان سمیس) بۆ وەزارەتی دەرەوەی بریتانی له ١٦ی مایسی ١٩١٤ بەلگەنامه(Ref:Fo.195-24) دەلێ ناوی شیخ عبدالسلام بارزانی به (شیخ النصرانی) دەهات،لەبەر ئەوەی ئەوەندە باش بوه بۆ مسیحیەکان، کاهینێکی گەڕیدە هاتبوه کوردستان وسەردانی ناوچەی بارزان وکوردستانی کردبو سەرسام بو بەوتەباییەی نێوان کوردستانیەکان له ئاینه جیاجیاکان کتێبێکی نوسیبوو بەناوی(مهد البشریه ـ الحیاه فی شرق کوردستان) شیخ عبدالسلامی بە(برایان بۆرۆ)ی ئیرلەندای شوبهاندبوو .

١١. هەروەك (تۆماس بوا) له ل١٩٧ کتێبی (تأريخ الأكراد) و ڕاپۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصلّ ص١٤٨) زۆرسەرچاوەی تر هاتوە: تورك و عەرەب وڕەگەزەکانی ترهاتوونە لەناوکورد تواینەوە، له ڕاپۆرتەکانی بەریتانیش ئەوە دەردەخا که لەسەردەمی عوسمانی تورك لەناو کورد تواینەوە بروانه :(تقرير المفتش العام الأول - FO. 371/12255) الصنف الثاني هم الأتراك الذين حسب المصادر و الوثائق التاريخية المتوفرة فقدوا هويتهم القومية و تكردوا…

١٢. بروانە: ماركس - نحو نقد لفلسفة الحق الهيجلية- ١٨٤٤م) وانوسراوة: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي . إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة ، هو قلب عالم لا قلب له ، مثلما هو روح وضع بلا روح . إنه أفيون الشعب .

١٣. بروانه : لينين–المختارات ج١ ص٥٦٠

١٤. بروانه :دەقی ووتارەکەی مام جلال بە بۆنەی یەکگرتنەوەی ئالای شۆرش و(ی ن ك) .

١٥. مایکل لوی – المارکسیه والدین ترجمه : بشیر السباعی ص٣

١٦. د جورج حنا– قصه الأنسان ص٦٥

١٧. *مارکس– انجلس بیان الشیوعی ص٦٤ .*

١٨. کاربوناری له سالی ١٨٠٧ له ناپۆلی ئیتالیا به مەبەستی یەکخستنەوەی هەمو ئیتالیا لەسەر بنەمای نەتەوایەتی ودامەزراندنی حکومەتیکی دەستوری دروست کراوه ،ماناشی دارکەره(یان ڕەژووکەری)،دوای له ١٨٣٠ شکستی هیناو (ماتزینی)ئیتالیای لاوی له ١٨٣١ لەجێی کاربۆناری دروست کرد.

١٩. غبدالرزاق الجسنی – تأريخ الوزرارات ج١ ص٢٩٩ .فقرة (٤) هي: ((ان بعض البلاد كانت في القديم تابعة للأمبراطورية العثمانية، وقد بلغت درجة راقية، يمكن معها الأعتراف مبدئيا بكيانها كأمم مستقلة، على أن تستمر الإرشاد والمساعدة من دولة أخرى، حتى يأتي الزمن الذي تصبح فيه قادرة على الوقوف بمفردها. ان اعتبار رغبات هذه البلاد يجب أن يكون في المقام الأول من إنتقاء الدولة المنتدبة))

٢٠. الأسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة ص٢٧٣

٢١. ئەو ڕێکەوتنه پیك هاتبوو له ٧ ماده له ٢٦/دیسمبر/١٩١٥ مۆر کرا ،جار وایه ریکەوتنی (دارین)یشی پێ دەووترێ .

## لە بڵاوکراوەکانی ستاندەر و نوسەر:

١. دۆزی کورد، فەشەلی عەلمانی و غیابی ئیسلامیەکان (سەلام ناوخۆش)
٢. هەڵبژاردن لەنێوان عەلمانی وئیسلامیەکان (مەسعود عبدالخالق)
٣. دەقەکانی سیڤەر وخویندنەوەیەکی تر (سەلام ناوخۆش) (مسعودعبدالخالق) بەهاوکاری (یەکێتی پەرلەمانتالرانی کوردستان) .٣جار چاپکرایتەوە.
٤. چارەنوسی فیدراڵی لە دوای دەرچو ونی عێراق لە بەندی (٧)-مسعود عبدالخالق
٥. کێشەی ئافرەت لە ڕوانگەی ئاینی و عەلمانی، بەهاریکاری یەکێتی خوشکانی یەکگرتووی کوردستان . مسعود عبدالخالق
٦. کێشەی کوردستان لە تورکیا و عێراق شێخ محمد باڵەک (وەرگێران)
٧. تیشکێک بۆ هەڵەکانی جیهادکردن لەرێی خوا (وەرگێران)
٨. دیواری دەسەڵات –شیعر- محسن شوانی
٩. بەرهەمەکانی سامی یوسف – گورانی -
١٠. ڕۆڵی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەت کورد (مەسعود عبدالخالق).
١١. کوردستانیەتی کەرکوک وناوچە دابڕێنراوەکان بە پێی بەلگەنامە نێودەولەتیەکان- مسعودعبدالخالق –لەلایەن (ی پ ک)بڵاوکرایتەوە ،لەو زوانە بەمەولەتی بەرێزیان دەبێتە زنجیرەی ١١ی ستاندەر.
١٢. مەوسوعەی جودی - مسعود عبدالخالق
١٣. ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان - مسعود عبدالخالق
١٤. ناسنامەی کەرکوک بە پێی بەلگەنامە نیودەولەتیەکان - مسعود عبدالخالق
١٥. رەوشی فلسفی لەسەدەی ٢١ - مسعود عبدالخالق
١٦. بە عەرەبی: الأسلام والعلمانیه واثرهما فی نشأه الدوله العراقیه الحدیثة - مسعود عبدالخالق
١٧. سەری سال ..ئەو نامیلکەیە والەبەر دەستت دایە.